# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كِتَابُ الإِخْلاصِ

تأليف

أبي بكر عبد الله بن محمّد بن عبيد بن سفيان
القرشي المعروف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێرانی :
مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردى

# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كتاب الإخلاص

تأليف

أبي بكر عبد الله بن محمد بن عبيد بن سفيان
القرشي المعروف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١ هـ)

وەرگێڕانی :
مَوسُوعَةُ إِبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردی

# کورتەیەک دەربارەی

ئیمامی ابن أبي الدنيا رحمه الله

أبوبكر عبدالله بن محمد بن عبيد بن سفيان بن قيس القرشي مولى بني أمية ناسراو به ابن أبي الدنيا له بەغداد له ساڵی (٢٠٨ هـ) لەدایک بووه له ماڵێکی پڕ عیلم و فەزڵ له ساڵی (٢٨٠ هـ) وەفاتی کردووه .

## شێخەکانی :

١ - باوکی خۆی رحمه الله

٢ - شيخ الإسلام پێشەوا أحمد بن حنبل رحمه الله

٣ - أبو جعفر محمد بن الحسين البرجلاني رحمه الله خاوەنی کتێبی الزهد والرقائق

٤ - أبو خيثمة زهير بن حرب رحمه الله

٥ - ئیمامی أبو عبيد القاسم بن سلام رحمه الله

٦ - ئیمامی البخاري رحمه الله ، وه زۆرێکی تریش

## تەلەبەکانی :

١ - أبو الحسن أحمد بن محمد العبدي

٢ - أبو علي الحسين بن صفوان البرذعي

٣ - أبو بكر أحمد بن سلمان البغدادي

٤ - أبو جعفر محمد بن عبدالله البغدادي

٥ - أبو بكر محمد بن خلف المحولي وه زۆرێکی تریش رحمهم الله

له بیروباوەڕدا لەسەر مەنهەجی سەلەفە رحمهم الله له فیقهیشدا لەسەر مەزهەبی ئیمامی أحمد ـە رحمه الله

# كتاب الإخلاص

١ - **قال ابن أبي الدنيا** : حدثنا أبو موسى الهروي إسحاق بن إبراهيم قال: حدثنا عمرو بن عبد الجبار أبو معاوية السنجاري ابن أخت عبيدة بن حسان قال : حدثنا عبيدة ابن حسان، عن عبد الحميد بن ثابت بن ثوبان مولى رسول الله ﷺ، قال : حدثنا أبي، عن جدي، قال : شهدت في رسول الله ﷺ يوماً مجلساً فقال : (طوبي للمخلصين، أولئك مصابيح الهدى تنجلي عنهم كل فتنة ظلماء).

١ - له عبدالحميد بن ثابت بن ثوبان ـەوە ئەڵێ: باوکم بۆی گێڕاینەوە لە باپیرمەوە کە فەرموویەتی : ڕۆژێک ئامادەی مەجلیسی رسول الله ﷺ بووم ئەیفەرموو : (سەرفرازی بۆ موخلیصان، ئەوانە ڕووناکی هیدایەتن هەموو فیتنەیەکی تاریکی ئەڕەوێیننەوە).

٢ - **قال ابن أبي الدنيا** : حدثنا داود بن محمد، أنه سمع أبا عبد النباجي يقول : (خمس خصال بها تمام العمل : الإيمان بمعرفة الله، ومعرفة الحق، وإخلاص العمل لله، والعمل على السنة، وأكل الحلال؛ فإن فقدت واحدة لم يرتفع العمل؛ وذلك أنك إذا عرفت الله ولم تعرف الحق لم تنتفع، وإذا عرفت الحق ولم تعرف الله لم

تنتفع، وإن عرفت الله وعرفت الحق ولم تخلص العمل لم تنتفع، وإن عرفت الله وعرفت الحق وأخلصت العمل ولم يكن على السنة لم تنتفع، وإن تمت الأربع ولم يكن الأكل من حلال لم تنتفع).

٢ - أبا عبد النباجي ئەڵێ: (پێنج خەسڵەت هەیە کە کردار پێی کامل ئەبێت: ئیمان بە ناسینی الله، وە ناسینی حەق، وە پاڵفتەکردنی کردار بۆ الله، وە کردار لەسەر سوننەت، وە نانی حەڵاڵ، ئەگەر بێتو یەکێکیان نەمێنێت ئەوا کردار بەرزنابێتەوە، وە بۆیە کاتێک الله ت ناسی حەقت نەناسی ئەوا سوودت پێ ناگەیەنێت، وە کاتێک حەقت ناسی الله ت نەناسی ئەوا سوودت پێ ناگەیەنێت، وە ئەگەر الله ت ناسی و حەقت ناسی کردارەکەت پاڵفتە نەکرد ئەوا سوودت پێ ناگەیەنێت، وە ئەگەر الله ت ناسی و حەقت ناسی و کردارەکەت پاڵفتە کرد لەسەر سوننەت نەبوو ئەوا سوودت پێ ناگەیەنێت، وە ئەگەر هەر چواریان تەواو بوو نانەکەت حەڵاڵ نەبوو ئەوا سوودت پێ ناگەیەنێت.

٣ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا محمد بن يزيد، قال حدثنا إسحاق بن سليمان، حدثنا أبو جعفر الرازي، عن الربيع بن أنس قال: (علامة الدين الإخلاص لله، وعلامة العلم خشية الله).

٣ - الربيع بن أنس ئەڵێ: (نیشانەی دین ئیخلاص بۆ الله یە، وە نیشانەی عیلم ترسان لە الله یە).

٤ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا سريج بن يونس، وإسحاق بن إسماعيل، وغيرهما، قالوا : حدثنا جرير بن عبد الحميد، عن عبد العزيز بن رفيع عن أبي ثمامة قال: قال الحواريون لعيسى عليه السلام ما الإخلاص لله ؟

قال : (الذي يعمل العمل لا يحب أن يحمده عليه أحد من الناس) .

قالوا : فمن المناصح لله ؟

قال : (الذي يبدأ بحق الله قبل حق الناس؛ إذا عرض عليه أمران أحدهما للدنيا والآخر للآخرة بدأ بأمر الله قبل أمر الدنيا) .

٤ - أبي الثمامة ئەڵێ : حەوارییەکان بە عیسایان وت علیه السلام ئیخلاص بۆ الله چیە ؟

فەرمووی : (ئەوەی کردەوەیەک ئەنجام ئەدات حەز ناکات هیچ کەسێک لە خەڵکی سوپاسی بکات لەسەری) .

وتیان : کەسی دڵسۆز بۆ الله کێیە ؟

فەرمووی : (ئەوەی دەست پێ ئەکات بە حەقی الله پێش حەقی خەڵکی؛ ئەگەر دوو کار بخرێتە بەردەستی کە یەکێکیان بۆ دونیایە و ئەوی تریان بۆ قیامەتە ئەوە بە کاری الله دەست پێ ئەکات پێش کاری دونیاکە) .

٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني سفيان بن وكيع، حدثنا ابن عيينة، عن عطاء بن السائب قال : بلغني عن علي بن أبي طالب الله قال : (العمل الصالح الذي لا تريد أن يحمدك عليه أحد إلا الله) .

٥ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (کردەوەی صالح؛ ئەوەیە ناتەوێت هیچ کەسێک ستایشت بکات لەسەری جگە لە الله) .

٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن الحسين، حدثنا خلف بن تميم، حدثنا عمرو بن الرحال الحنفي، حدثنا العلاء بن السائب، حدثنا أبو إسحاق، عن عبد خير قال : قال علي بن أبي طالب : (لا يقل عمل مع تقوى، وكيف يقل ما يتقبل ؟!) .

٦ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (کردەوەیەک لەگەڵ تەقوا بێت کەم نابێتەوە، چۆن کەم ئەبێتەوە لەکاتێکدا قبوڵ ئەبێت ؟!) .

---

واتە : هەر ئەوەندەی بە ئیخلاصەوە بێت و لەگەڵ تەقوا بێت ئەگەرچی کەمیش بێت ئەوە هەر گەورەیە والله أعلم .

٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني يعقوب بن إسماعيل، أخبرنا حبّان بن موسى، أخبرنا عبد الله ابن المبارك، أخبرنا ابن لهيعة، حدثني ابن غزية، عن حمزة من بعض ولد ابن مسعود

قال : (طوبى لمن أخلص عبادته ودعاءه لله، ولم يُشغل قلبه ما تراه عيناه، ولم ينسه ذكره ما تسمع أذناه، ولم يحزن نفسه ما أعطي غيره) .

٧ - ابن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی عیبادەتەکەی و دوعاکەی پاڵفتە کردووە بۆ الله، دڵی سەرقاڵ نەکات بەوەی کە چاوەکانی ئەیبینێت، وە ئەوەی گوێیەکانی ئەیبیستێت یادکردنەوەی ئەوی - واته الله تعالى - ی لەبیر ناکات، وە دڵی غەمبار نابێت ئەوەی ئەبەخشرێت بە جگە لە ئەو) .

٨ - **قال إبن أبي الدُنيا :** حدثني محمد بن الحسين، حدثني عمار بن عثمان الحلبي، حدثنا سرار العنزي قال : سمعت عبد الواحد بن زيد يقول : (الإجابة مقرونة بالإخلاص، لا فرقة بينهما) .

٨ - عبدالواحد بن زيد ئەڵێ : (وەڵامدانەوە پەیوەستە بە ئیخلاصەوە، جیاوازی نیە لە نێوانیاندا) .

٩ - **قال إبن أبي الدُنيا :** حدثني أبو محمد البزار، حدثنا المسيب بن واضح، عن محمد بن الوليد قال : مر عمر بن عبد العزيز برجل في يده حصى يلعب به وهو يقول : اللهم زوجني من الحور العين .

فقام عليه عمر فقال : بئس الخاطب أنت، ألا ألقيت الحصى وأخلصت الله الدعاء.

**٩** - محمد بن الوليد ئەڵێ : عمر بن عبدالعزيز دای بەلای پیاوێکدا لەدەستیدا بەردێکی تیابوو یاری پێ ئەکرد وە ئەیوت یا الله بمکەی بە هاوسەری حۆری .

عمر چووە لای و پێی وت : خراپترین داواکاریت تۆ، بۆچی بەردەکە فرێ نادەیت و دوعاکەت پاڵفتە ناکەیت بۆ الله .

**١٠ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا أبو جعفر الكندي، حدثنا عبد المجيد بن عبد العزيز**

بن أبي واقد، عن أبيه، قال علي بن أبي طالب رضي الله عنه : (كونوا لقبول العمل أشد هماً منكم بالعمل؛ ألم تسمعوا الله يقول: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ [**المائدة : ٢٧**] .

**١٠** - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (با گرنگی دانتان بۆ قبوڵ بوونی کردەوەکە زیاتر بێت وەک لە ئەنجامدانی کردەوەکە، ئایا گوێتان لێ نەبووە الله ئەفەرمووێ : ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ [**المائدة : ٢٧**] .

**١١ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني أبو مسلم عبد الرحمن بن يونس، قال : حدثنا أبو**

أسامة عن الأعمش، قال : سمعت إبراهيم يقول : (إن الرجل ليعمل العمل الحسن في أعين الناس، أو العمل لا يريد به وجه الله، فيقع له المقت والعيب عند الناس حتى يكون عيباً، وإنه ليعمل العمل أو الأمر يكرهه الناس يريد به وجه الله فيقع له المقة والحسن عند الناس) .

**١١** - إبراهيم النخعي ئەڵێ: (پیاو کردەوەیەکی باش ئەنجام ئەدات لەبەرچاوی خەڵکی، یان کردەوەیەک کە مەبەست پێی الله نیە، تورەیی و عەیبی خەڵکی دێتە

سەر تا ئەبێتە عەیبە، وە کردەوەیەک ئەنجام ئەدات خەڵکی ڕقی لێیەتی مەبەست پێی الله یە ئەبێتە باشە لای خەڵکی).

**١٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا داود بن عمرو الضبي، قال: حدثنا أبو شهاب، عن ليث عن محمد بن واسع قال : (إذا أقبل العبد إلى الله أقبل الله بقلوب العباد إليه).**

١٢ - محمد بن واسع ئەڵێ : (ئەگەر بەندە ڕووی کردە الله ئەوا الله دڵی بەندەکانی تێ ئەکات).

**١٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبد الملك بن إبراهيم، حدثنا سعيد بن عامر، عن حزم القطعي عن عبد الملك بن عتاب اللتي قال : (رأيت عامر بن عبد قيس في النوم فقلت : أي الأعمال وجدت أفضل ؟**

**قال : ما أريد به وجه الله).**

١٣ - عبدالملك بن عتاب اللتي ئەڵێ : (عامر بن عبد قيس م بینی لە خەودا، پێم وت : کام کردەوانە باشترینە ؟

وتی : ئەوەی مەبەست پێی الله یە).

١٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا محمد بن بشير، حدثنا عبد الرحمن بن جرير قال : سمعت أبا حازم يقول : (عند تصحيح الضمائر تغفر الكبائر، وإذا عزم العبد على ترك الآثام أتته الفتوح).

١٤ - أبا حازم ئەڵێ : (لەکاتی چاک کردنی ئەوەی لە نەفستدایە، تاوانە گەورەکان ئەبوردرێ، وە کاتێک بەندە سوور بوو لەسەر وازهێنان لە تاوانەکان ئەوە ڕزگاری و سەرکەوتنی بەرەو ڕووی دێت).

١٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الهيثم بن خارجة، حدثنا عبد ربه بن عبد الله الفلسطيني عن مولى لابن محيريز قال : (دخلت مع ابن محيريز حانوت بزاز ليشترتي منه متاعاً فرفع في السوم ولم يعرفه، فأشرت إليه أنه ابن محيريز ، فقال : اخرج، إنما نشتري بأموالنا لا بأدياننا).

١٥ - مەولاکەی ابن محيريز ئەڵێ : (لەگەڵ ابن محيريز چوومە دوکانی قوماش فرۆشێکەوە بۆ ئەوەی هەنێک پێداویستی لێ بکڕین، داوای پارەی کرد و نەیناسیەوە، منیش ئاماژەم بۆ کرد کە ئەوە ابن محيريز ە وتی : بچۆ دەرەوە، ئێمە بە پارەکەمان ئەیکڕین نەک بە دینەکەمان).

١٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني أبوهاشم، حدثنا أحمد بن أبي الحواري، حدثنا المضاء بن عيسى الدمشقي قال : (مر سليمان الخواص بإبراهيم بن أدهم، وهو عند قوم قد أضافوه وأكرموه .

فقال : نعم الشيء هذا يا أبا إبراهيم إن لم يكن تكرمة دين ) .

١٦ - المضاء بن عيسى الدمشقي ئەڵێت : (سليمان الخواص داى بەلاى إبراهيم بن أدهم دا كە لاى كەسانێک بوو كە میوانداریان ئەكرد و ڕێزیان لێ ئەگرت ، پێی وت : ئەمە باشترین شتە ئەی أبا إبراهيم ئەگەر بێتو ئەم ڕێزگرتنە لەبەر دین نەبێت ) .

١٧ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني يعقوب بن إسماعيل قال : حدثنا حبان بن موسى ، أخبرنا عبد الله ، أخبرنا الأوزاعي ، عن يحيى بن أبي كثير قال : (يصعد الملك بعمل العبد مبتهجا ، فإذا انتهى إلى ربه قال : اجعلوه في سجين ، فإني لم أرد بهذا ) .

١٧ - يحيى بن أبي كثير ئەڵێ: (فريشتە بە دڵخۆشیەوە بە كردەوەی بەندەیەک سەرئەكەوێت ، كاتێک گەشتە لاى پەروەردگارى ، ئەفەرمووێ : دایبنێن لە سجين ، مەبەست لەم كارە من نەبوو ) .

١٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا يعقوب ، أخبرنا حبان ، أخبرنا عبد الله ، أخبرنا ابن أبي مريم الغساني ، عن ضمرة بن حبيب قال : قال رسول الله ﷺ : (إن الملائكة يرفعون عمل العبد من عباد الله فيكثرونه ويزكونه حتى ينتهوا به حيث شاء الله من سلطانه فيوحي إليهم أنكم حفظة على عمل عبدي ، وأنا رقيب على ما في نفسه ، إن عبدي هذا لم يخلص لي عمله فاجعلوه في سجين ، ويصعدون بعمل العبد من عباد الله ، يستقلونه ، ويحتقرونه ، حتى ينتهوا به حيث شاء الله ، فيوحي الله إليهم أنكم حفظة على عمل عبدي ، وأنا رقيب نفسه ، فضاعفوه له ، واجعلوه في عليين ) .

١٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (فریشتەکان کردەوەی بەندەیەک لە بەندەکانی الله بەرز ئەکەنەوە، بەسەریدا هەڵئەدەن و تەزکیەی ئەکەن تا ئەیگەیەنن بەو شوێنەی الله ئەیەوێت، وەحیان بۆ ئەکات کە ئێوە پارێزەری کردەوەی بەندەکەمن، وە من چاودێرم بەسەر ئەوەی لە نەفسیدایە، ئەم بەندەیەم کردەوەکەی بۆ پاڵفتە نەکردووم، دایبنێن لە سجین، وە سەرئەکەون بە کردەوەی بەندەیەک لە بەندەکانی الله، بە بچوک و کەمی دائەنێن، تا ئەیگەیەنن بەو شوێنەی الله ئەیەوێت، الله وەحیان بۆ ئەکات کە ئێوە پارێزەری کردەوەی بەندەکەمن، وە من چاودێری نەفسیم، بۆی زیاد بکەن، وە دایبنێن لە علیین).

١٩ - قال إبن أبي الدّنيا : بلغني عن ابن جميل قال : سمعت عبدة بن سليمان قال : حدثنا محمد بن أبي منصور : (أن عابدا في بني إسرائيل عبد الله في سرب أربعين سنة، فكانت الملائكة ترفع عمله إلى السماء فلا يقبل؛ فقالت الملائكة : وعزتك ربنا ما رفعنا إليك إلا خفاء، قال : صدقتم ملائكتي، ولكنه يحب أن يعرف مكانه).

١٩ - محمد بن أبي منصور ئەڵێ : (خواپەرستێک لە بەنی ئیسرائیل الله ی پەرست بۆ ماوەی چل ساڵ لە ژورێکدا، فریشتە کردەوەکەیان بەرز ئەکردەوە بۆ ئاسمان قبوڵ نەئەکرا، فریشتەکە فەرمووی : بە عیزەتت پەروەردگارمان بەرزمان نەکردووەتەوە ئیللا شتی شاراوە نەبێت، فەرمووی : ڕاست ئەکەن فریشتەکانم، بەڵام ئەو پێی خۆشە کە پێگەکەی بزانن).

٢٠ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني يعقوب بن إسماعيل، أخبرنا حبان بن موسى، أخبرنا عبد الله، أخبرنا رشدين بن سعد، عن شراحيل بن يزيد عن عبيد بن عمرو أنه سمع فضالة بن عبيد يقول : (لأن أكون أعلم أن الله قد تقبل مني مثقال حبة من خردل أحب إلي من الدنيا وما فيها؛ لأن الله يقول : ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ [**المائدة : ٢٧**] .

٢٠ - فضالة بن عبيد ئەڵێ: (ئەگەر بزانم كە الله میسقاڵە خەردەلێكی لێ قبوڵ كردووم پێم خۆشترە لە دونیا و ئەوەشی تیایەتی، لەبەر ئەوەی الله ئەفەرمووێ : ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ [**المائدة : ٢٧**] .

٢١ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني عبد الرحيم بن بحر، قال: حدثنا عثمان بن عمارة، عن إسماعيل بن كثير السليمي قال : قيل لعطاء السليمي: ما الحذر ؟

قال : (الاتقاء على العمل ألا يكون لله) .

٢١ - إسماعيل بن كثير السليمي ئەڵێ: بە عطاء السليمي م وترا : خۆراپارستن و ئاگاداربوون چییە ؟

وتی : (ئاگاداربوون لە كردەوە لەوەی تەنها بۆ الله بێت) .

٢٢ - قال إبن أبي الدنيا : حدثنا محمد بن علي بن شقيق، حدثنا إبراهيم بن الأشعث، عن فضيل بن عياض : ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ [هود : ٧، الملك : ٢] .

قال : (أخلصه وأصوبه، إن العمل إذا كان خالصاً ولم يكن صواباً لم يقبل، وإذا كان صواباً ولم يكن خالصاً لم يقبل حتى يكون خالصاً صواباً، والخالص: إذا كان الله، والصواب: إذا كان على السنة) .

٢٢ - فضيل بن عياض دەربارەی ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ ئەڵێت : (پاڵفتەکراوترین و پێکراوترین، ئەگەر کردەوە خالص بێت و درووست نەبێت قبوڵ ناکرێت، ئەگەر درووست بێت و خالص نەبێت قبوڵ ناکرێت هەتا خالص و درووست نەبێت، خالص کاتێکە بۆ الله بێت، درووست کاتێکە لەسەر سوننەت بێت) .

---

: وتەی (وأصوبه : پێکراوترین) واتە بیدعە نەبێت و سوننەتی رسول الله ی ﷺ پێکابێت .

٢٣ - قال إبن أبي الدنيا : حدثنا أبو محمد القاسم بن هاشم السمسار، حدثنا الحسن بن قتيبة، حدثنا محمد بن إسحاق، عن محمد بن علي قال : قال علي بن أبي طالب رضي الله عنه : (من كان ظاهره أرجح من باطنه خف ميزانه يوم القيامة، ومن كان باطنه أرجح من ظاهره ثقل ميزانه يوم القيامة) .

٢٣ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (هەرکەس ڕووکەشی باشتر بێت لە ناخی تەرازووەکەی - تەرازووی کردەوەکان - سوک ئەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا، هەرکەسیش ناخی باشتر بوو لە ڕووکەشی میزانەکەی قورس ئەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا).

٢٤ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني عبد الرحمن بن صالح، حدثني المحاربي، عن سفيان، عن زبيد قال : (من كانت سريرته أفضل من علانيته فذلك الفضل، ومن كانت سريرته مثل علانيته فذلك النصف، ومن كانت سريرته دون علانيته فذلك الجور) .

٢٤ - زبيد ئەڵێ : (ئەوەی نهێنی باشتر بێت لە ئاشکرای ئەوە زیادی بۆ هەیە، وە ئەوەی نهێنی وەکو ئاشکرای بێت ئەوە نیوە بە نیوەیە، ئەوەی نهێنی لەخوار ئاشکرایەوە بێت ئەوە وێرانیە) .

٢٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبد الرحمن بن صالح، حدثنا الحسين بن علي الجعفي، عن معقل بن عبيد الله الجزري قال : (كانت العلماء إذا التقوا تواصوا بهذه الكلمات، وإذا غابوا كتب بها بعضهم إلى بعض : أنه من أصلح سريرته أصلح الله علانيته، ومن أصلح ما بينه وبين الله كفاه الله ما بينه وبين الناس، ومن اهتم بأمر آخرته كفاه الله أمر دنياه).

٢٥ - معقل بن عبيدالله الجزري ئەڵێ : (زانایان کاتێک بگەشتنایە بە یەکتر بەم وشانە وەسیەتیان بۆ یەکدی ئەکرد، کاتێکیش لەیەک دووربوونایە هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان ئەنووسی : هەرکەس نهێنی باش بکات الله ئاشکرای باش ئەکات، هەرکەس نێوان خۆی و الله باش بکات ئەوا الله ی بەسە بۆ ئەوەی لە نێوان ئەو و

خەڵكدايە، وە هەركەس گرنگی بدا بە كاروباری قیامەتی ئەوا الله ی بەسە بۆ كاروباری دوونیای) .

٢٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني سريج بن يونس، حدثنا الوليد بن مسلم، عن الأوزاعي عن بلال بن سعد قال : (لا تكن ولياً الله في العلانية وعدوه في السريرة) .

٢٦ - بلال بن سعد ئەڵێ : (مەبە بە دۆستی الله لە ئاشكرادا و دووژمنی لە نهێنیدا) .

٢٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني بشر بن معاذ، عن شيخ من قريش قال : قال عمر بن عبد العزيز : (يا معشر المستترين اعلموا أن عند الله مسألة فاضحة؛ قال تعالى : ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْتَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [الحجر : ٩٢ - ٩٣] .

٢٧ - عمر بن عبدالعزيز ئەڵێ : (ئەی گرۆی داپۆشراوەكان بزانن لای الله پرسیارێكی ئاشكراكەر هەیە، الله تعالى ئەفەرمووێ : ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْتَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [الحجر : ٩٢ - ٩٣] .

٢٨ - قال إبن أبي الدّنيا : وحدثني سريج، حدثنا الوليد، عن الأوزاعي قال : سمعت بلال بن سعد يقول : (لا تكن ذا وجهين وذا لسانين؛ تظهر للناس ليحمدوك، وقلبك فاجر) .

٢٨ - بلال بن سعد ئەڵێ : (دووڕوو و دوو زمان مەبە، دەری بخەیت بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی ستایشت بکەن، وە دڵیشت فاجر بێت) .

٢٩ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن عثمان العجلي، حدثنا أبو أسامة، عن** الربيع قال : (وعظ الحسن يوماً، فانتحب رجل؛ فقال الحسن : ليسألنك الله يوم القيامة ما أردت بهذا) .

٢٩ - الربيع ئەڵێ : (ڕۆژێک الحسن ئامۆژگاریی ئەکرد، پیاوێک بە توندی گریا، الحسن وتی : الله لە ڕۆژی قیامەتدا لێت ئەپرسێتەوە کە مەبەستت لەمە چی بوو) .

٣٠ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا محمد بن علي بن الحسن، عن إبراهيم بن الأشعث،** عن فضيل بن عياض سمعته يقول: (خير العمل أخفاه، أمنعه من الشيطان وأبعده من الرياء) .

٣٠ - فضيل بن عياض ئەڵێ : (باشترین کردەوە شاراوەترینیانە، پارێزراوترینە لە شەیطان، وە دوورترینە لە ڕیا) .

٣١ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثني مهدي بن حفص قال : حدثنا إسماعيل بن عياش** **عن مطعم بن المقدام الصنعاني، عن عنبسة بن سعيد الكلاعي، عن نصيح العنسي، عن ركب**

المصري قال : قال رسول الله ﷺ : (طوبى لمن طاب كسبه، وصلحت سريرته وكرمت علانيته، وعزل عن الناس شره).

٣١ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (بەهەشت بۆ ئەو کەسەی کاسپیەکەی پاک بێت، وە نهێنیەکەی باش بێت، وە ئاشکراکەی ڕێزدار بێت، وە خەڵکی دوور بێت لە شەڕی).

٣٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبد الرحمن بن صالح، حدثنا أبو بكر بن عياش، عن عاصم قال : (كان أبو وائل إذا خلا بكى؛ فسمعته يقول إذا سجد رب ارحمني، رب اعف عني، رب إن تعف عني تعف طولاً من قبلك، وإن تعذبني تعذبني غير ظالم ولا مسبوق، ثم يشيج كأشد نشيج الثكلى، ولو جعلت له الدنيا على أن يبكي وأحد يراه لم يفعل).

٣٢ - عاصم ئەڵێ : (أبو وائل کاتێک بە تەنها ببوایە ئەگریا، وە گوێم لێ بوو کاتێک سەجدەی برد ئەیوت : پەروەردگار ڕەحمم پێ بکە، پەروەردگار لێم خۆش بە، پەروەردگار ئەگەر تۆ لێم خۆش بیت لێخۆشبوونێکی زۆر لەلایەن تۆوەیە، وە ئەگەر سزام بدەیت سزام ئەدەیت بەبێ ئەوەی ستەمم لێ بکەیت و پێشم بکەویت، دواتر دەنگێک لە سنگیەوە دەرچوو بە توندی وەک دەنگی دایکێک کە ڕۆڵەکەی ون کرد بێت، ئەگەر بێتو دونیات پێ بدایە لەسەر ئەوەی بگری و کەسێک ببینێ ئەوا نەیئەکرد).

٣٣ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني عبد الرحمن بن صالح قال : حدثنا عبيدة بن حميد، عن منصور عن هلال بن يساف قال : حدثت أن عيسى بن مريم كان يقول : (إذا كان يوم صوم أحدكم فليدهن لحيته بدهن، ويمسح شفتيه حتى يرى الناس أنه ليس بصائم، وإذا أعطى شيئاً بيمينه فليخفه من شماله، وإذا صلى في بيته فليلق عليه ستره، فإن الله يقسم الثناء كما يقسم الرزق).

٣٣ - هلال بن يساف ئەڵێ : بۆم گێڕدراوەتەوە كە عيسى بن مريم عليه السلام ئەيفەرموو : (کاتێک یەکێکتان بەڕۆژوو بوون با ڕیشی چەور بکات بە ڕۆن، وە بیدات لە لێوەکانی تا خەڵک ببینن و وا بزانن بە ڕۆژوو نیە، وە کاتێک شتێکی بەخشی بە دەستی ڕاستی با بیشارێتەوە لە دەستی چەپی، وە کاتێک نوێژی کرد لە ماڵەکەی با پەردەیەک دابنێت، لەبەر ئەوەی الله ستایشی دابەشکردووە وەک چۆن ڕزقی دابەش کردووە).

٣٤ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني عصمة بن الفضل، قال: حدثنا يحيى بن يحيى، عن داود بن المغيرة قال : سمعت أبا حازم يقول : (السر أملك بالعلانية من العلانية بالسر، والفعل أملك بالقول من القول والفعل).

٣٤ - أبا حازم ئەڵێ : (نهێنی باڵادەستترە لە ئاشکرا وەک لە ئاشکرا بە نهێنی، وە کردەوە باڵادەستترە لە وتە وەک لە وتە بە کردەوە).

٣٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الحسن بن يحيى قال : حدثنا عبد الرزاق عن معمر قال : (بكي رجل إلى جنب الحسن ، فقال : قد كان أحدهم يبكي إلى جنب صاحبه فما يعلم به) .

٣٥ - معمر ئەڵێ : (پیاوێک لە تەنیشت الحسن گریا ، وتی: یەکێک لە ئەوان - واتە لە سەلەف پێش الحسن البصري - ئەگریا لە تەنیشت هاوەڵەکەی و ئەویش پێی نەئەزانی) .

٣٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن يحيى بن أبي حاتم، أخبرنا يحيى بن حريث العبدي، عن يوسف بن عطية، عن محمد بن واسع قال : (لقد أدركت رجالاً؛ كان الرجل يكون رأسه ورأس امرأته على وساد واحد قد بل ما تحت خده من دموعه لا تشعر به امرأته ، والله لقد أدركت رجالاً كان أحدهم يقوم في الصف فتسيل دموعه على خده لا يشعر الذي إلى جنبه) .

٣٦ - محمد بن واسع ئەڵێ : (گەشتم بە پیاوانێک ، کە سەری پیاوەکە و سەری خێزانی لەسەر یەک سەرین بوو فرمێسکەکانی لە ژێر ڕوومەتی ئەڕۆشتن خێزانیشی هەستی پێ نەئەکرد ، والله گەشتم بە پیاوانێک کە یەکێکیان ئەوەستا لە ڕیزی نوێژدا فرمێسکەکانی ئەهاتنە خوار بە ڕوومەتیدا ئەوەی تەنیشتی هەستی پێ نەئەکرد) .

٣٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبيد الله بن عمر الجشمي، حدثنا جعفر، عن أبي التياح قال : (إن كان الرجل يتعبد عشرين سنة وما يعلم به جاره) .

٣٧ - أبي التياح ئەڵێ : (پیاو هەبووە بیست ساڵ عیبادەتی ئەکرد وە دراوسێکەی پێی نەئەزانی) .

٣٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني خالد بن خداش، حدثني مالك بن أنس، عن الزهري، عن عبيد الله بن عبد الله قال : (كان لا يعرف البر في عمر ولا ابن عمر حتى يقولا أو يعملا) .

٣٨ - عبيدالله بن عبدالله ئەڵێ : (چاکەت نەئەدی لە عمر و ابن عمر تا باسیان ئەکرد یان ئەنجامیان ئەدا) .

: واتە چاکەکانیان هەمیشە شاراوە بووە .

٣٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبيد الله بن عمر قال: حدثنا حماد بن زيد، حدثنا هشام، عن الحسن قال : (إن كان الرجل ليتعبد عشرين سنة ما يعلم به جاره).

قال حماد : (ولعل أحدكم يصلي ليلة أو بعض ليلة، فيصبح وقد طال على جاره).

٣٩ - الحسن ئەڵێ : (پیاو هەبووە بیست ساڵ عیبادەتی ئەکرد دراوسێکەی پێی نەئەزانی) .

حماد ئەڵێت : (لەوانەیە یەکێک لە ئێوەش شەوێک یان بەشێکی شەوێک نوێژ بکات، پاشان بەیانی بکاتەوە و خۆی بە باشتر بزانێت لە دراوسێیەکەی ) .

٤٠ - **قال إبن أبي الدنيا : حدثنا خالد بن خداش وعبيد الله بن عمر قالا : حدثنا حماد** بن زيد، عن يونس بن عبيد، عن الحسن قال : (إن كان الرجل ليجتمع إليه القوم، أو يجتمعون، يتذاكرون، فتجيء الرجل عبرته فيردها، ثم تجيء فيردها، ثم تجيء فتردها، فإذا خشي أن يفلت قام) .

٤٠ - الحسن البصري ئەڵێ : (پیاوی وا هەبووە خەڵکی لەلای کۆ بوونەتەوە، یان کۆبوونەتەوە، باسیان کردووە - **واتە باسی مردن و قەبر و قیامەت و . . .** - جا پیاوەکە گریانی دێت بەڵام ئەیگرێت، پاشان گریانی دێت بەڵام ئەیگرێت، پاشان گریانی دێت بەڵام ئەیگرێت، دواتر کە ترسا پێی بزانن هەستاوە ڕۆیشتووە ) .

٤١ - **قال إبن أبي الدنيا : حدثنا خالد بن خداش قال :** حدثنا حماد بن زيد قال : (بكي أيوب مرة فأخذ بأنفه، فقال : إن هذه الزكمة ربما عرضت، وبكى مرة أخرى فاستبنا بكاه فقال : إن الشيخ إذا كبر مج) .

٤١ - حماد بن زيد ئەڵێ : (جارێکیان أيوب السختياني گریا لوتی گرت، وتی: لەوانەیە تووشی هەڵامەت بووبم، وە جارێکی تریان گریا لە گریانەکەی دەرکەوت، وتی: پیاو کە پیر بوو ملچەی دێ ) .

: واته أيوب رحمه الله نەیویستووە گریانەکەی دەربخات .

٤٢ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني يعقوب بن إسماعيل قال: حدثنا حبان بن موسى، حدثنا عبد الله بن المبارك قال : (أخبرني رجل عن أبي السليل أنه كان يحدث أو يقرأ، فيأتيه البكاء فيصرفه إلى الضحك) .

٤٢ - عبدالله بن المبارك ئەڵێ : (پیاوێک هەواڵی پێدام کە أبي السليل فەرموودەی بگێڕایەتەوە یان قورئانی بخوێندایەتەوە، گریانی بهاتایە ئەیگۆڕی بۆ پێکەنین) .

٤٣ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني يعقوب، أخبرنا حبان، أخبرنا عبد الله، أخبرنا المعتمر، عن كهمس بن الحسن، عن بعض أصحابه : (أن رجلاً تنفس عند عمر كأنه يتحازن فلكزه عم)، أو قال: (لكمه).

٤٣ - كهمس بن الحسن لە یەکێک لە هاوەڵەکانیەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێ: (پیاوێک لای عمر بن عبدالعزيز هەناسەیەکی هەڵکێشا وەک ئەوەی خەمبار بێت عمر بۆکسێکی لێدا) .

٤٤ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا محمد بن علي بن الحسن، عن إبراهيم بن الأشعث قال : سمعت أبا عصام الرملي، عن رجل، عن الحسن أنه حدث يوماً، أو وعظ فتنفس

في مجلسه رجل، فقال الحسن : (إن كان لله فقد شهرت نفسك، وإن كان لغير الله هلكت) .

٤٤ - الحسن ڕۆژێک فەرموودەی ئەگێڕایەوە یان ئامۆژگاری ئەکرد، پیاوێک لە مەجلیسەکەیدا هەناسەیەکی هەڵکێشا، الحسن وتی: (ئەگەر بۆ الله بووبێت ئەوە خۆتت ناساند، وە ئەگەر بۆ غەیری الله بوو بێت ئەوا تیا چوویت) .

---

**: لەم جۆرە باسانەدا کە ئامانج لێی وەرگرتنی پەند و سوود بینینە زانایانی سەلەف چەند ئەثەرێک ئەهێنن کە سەنەدەکەی لاوازە، بەڵام لەڕووی ماناوە کێشەی تێدا نییە لەبەر ئەوە لە کتێبەکاندا هێناویانە، بەداخەوە لەم جۆرە بابەتانەدا خەڵکی ئێستا ئەوەندە گرنگی بە لاوازی و بەهێزی سەنەد ئەدەن ئەوەندە گرنگی بە سوود بینین لە ئەثەرەکە نادەن، ئەوەش کارێکی باش نییە .**

٤٥ - قال إبن أبي الدّنيا : **حدثنا خالد بن خداش وعبيد الله بن عمر قالا : حدثنا حماد** بن زيد عن يونس عن الحسن قال : (إن كان الرجل ليكون عنده الزور فيصلي الصلاة الطويلة أو الكثيرة من الليل ما يعلم بها زوره).

٤٥ - الحسن البصري ئەڵێ : (پیاو هەبووە میوانی هەبووە نوێژێکی زۆر یان درێژی ئەکرد لە شەودا وە میوانەکەی پێی نەزانیوە) .

٤٦ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا خالد وعبيد الله قالا : حدثنا حماد عن يونس، عن** الحسن قال : (إن كان الرجل لتكون له الساعة، يخلو فيها فيصلي فيوصي أهله فيقول : إن جاء أحد يطلبني فقولوا : هو في حاجة له ) .

٤٦ - الحسن البصري ئەڵێ : (پیاو هەبووە کاتێکی هەبووە کە تەنیا ئەبووەوە و نوێژی ئەکرد، وەصیەتی بۆ ماڵەوە ئەکرد و ئەیوت : ئەگەر کەسێک هات منی ئەویست بڵێن خەریکی پێویستییەکی خۆیەتی ) .

٤٧ - **قال إبن أبي الدّنيا : حدثني أحمد بن إبراهيم بن كثير، حدثنا عبد المؤمن أبو** عبد الله قال : (كان الحسان بن أبي سنان في حانوته ستر، فكان يخرج سلة الحساب وينشر حسابه، ويصعد غلاماً على الباب ويقول: إذا رأيت رجلاً قد أقبل، ترى أنه يريدني فأخبرني، ثم يقوم فيصلي، فإذا جاء رجل أخبره الغلام، فيجلس كأنه على الحساب ) .

٤٧ - أبو عبدالله ئەڵێ : (حسان بن أبي سنان لە دوکانەکەیدا پەردەیەک هەبوو، سەلەی حسابەکەی دەرئەهێنا و دایئەنا، غوڵامێکی دائەنا لای دەرگاکە و پێی ئەوت : هەرکاتێک پیاوێک بینی دێت بۆ ئێرە، زانیت منی ئەوێت هەواڵم پێبدە، دواتر هەڵدەستا و نوێژی ئەکرد، کاتێک پیاوێک بهاتایە غوڵامەکەی هەواڵی پێئەدا، دائەنیشت وەک ئەوەی خەریکی حسابات بێت ) .

٤٨ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني أحمد بن إبراهيم، حدثني أبو محمد - يعني عبد الله بن عيسى - قال : أخبرني أبي قال : (كان حسان بن أبي سنان يحضر مسجد مالك بن دينار، فإذا تكلم مالك بكى حسان حتى يسيل ما بين يديه، لا يسمع له صوت) .

٤٨ - عبدالله بن عيسى ئەڵێ : باوكم هەواڵی پێدام وتی : (حسان بن أبي سنان ئامادەی مزگەوتی مالك بن دينار ئەبوو، كاتێک مالك قسەی بكردایە حسان ئەگریا هەتا فرمێسک ئەكەوتە بەردەمی، وە دەنگی نەئەبیسترا) .

---

: واتە دەنگی گریانی نەئەبیسترا .

٤٩ - **قال إبن أبي الدّنيا :** وحدثنا أحمد قال : حدثني أبو محمد قال : حدثنا محمد بن عبد الله الزراد قال: (ربما اشترى حسان بن أبي سنان أهل بيت الرجل وعياله، ثم يعتقهم جميعا، ثم لا يتعرف إليهم، ولا يعلمهم من هو)

٤٩ - محمد بن عبدالله الزراد ئەڵێ : (جاری وا هەبوو حسان بن أبي سنان پیاوێک و خانەوادەكەی ئەكڕی، پاشان ئازادی ئەكردن، دواتر خۆی نەئەناساند و نەیانئەزانی ئەو كێیە).

---

: واتە كۆیلە بوون، پاشان كڕیونی و ئازادی كردوون .

٥٠ - **قال ابن أبي الدّنيا :** حدثنا أحمد بن إبراهيم، حدثني شبابة بن سوار قال: أخبرني أبو الطيب موسى بن يسار قال : (صحبت محمد بن واسع من مكة إلى البصرة فكان الليل أجمع يصلي في المحمل جالسا يومىء برأسه إيماء، وكان يأمر الحادي أن يكون خلفه ويرفع صوته حتى لا يفطن له ).

٥٠ - موسى بن يسار ئەڵێ : (هاوڕێیەتی محمد بن واسع م کرد لە مەککەوە بۆ بەصرە، هەموو شەوەکە نوێژی ئەکرد لە شوێنێکدا بە دانیشتنەوە و بەسەری ئاماژەی ئەکرد، وە فەرمانی ئەکرد بە وشتروانەکە کە بکەوێتە پشتیەوە و دەنگی بەرزبکاتەوە تا پێی نەزانن ).

٥١ - **قال ابن أبي الدّنيا :** حدثني أبي قال : أخبرنا عبد العزيز بن أبان قال: حدثنا عمران بن خالد قال : سمعت محمد بن واسع قال : (إن كان الرجل ليبكي عشرين سنة ومعه امرأته ما تعلم به ).

٥١ - محمد بن واسع ئەڵێ : (پیاو هەبووە بیست ساڵ گریاوە خێزانیشی لەگەڵیدا بووە و پێی نەزانیوە ).

٥٢ - **قال ابن أبي الدّنيا :** حدثنا عاصم بن عامر بن علي ، حدثنا أبي ، عن عبد ربه بن أبي هلال، عن ميمون بن مهران قال : (تكلم عمر بن عبد العزيز ذات يوم

وعنده رهط من إخوانه، فصح له منطق وموعظة حسنة، فنظر إلى رجل من جلسائه، وهو يخذف دمعته، فقطع دمعته.

فقلت له: يا أمير المؤمنين امض في منطقك فإني أرجو أن يمن الله على من سمعه أو بلغه.

قال: إليك عني، فإن في القول فتنة، والفعال أولى بالمؤمن من القول).

**٥٢** - میمون بن مهران ئەڵێ: (ڕۆژێک عمر بن عبدالعزیز قسەی کرد و کۆمەڵێک لە برایانی لەگەڵدا بوو، جا قسەی باسی کرد و ئامۆژگاریەکەی کاریگەر بوو، جا تەماشای یەکێک لە ئامادەبووانی کرد بینی فرمێسک ئەسڕێت، جا پیاوەکە گریانەکەی ڕاگرت

منیش پێم وت: ئەی پێشەوای ئیمانداران بەردەوام بە لە قسەکردنەکەت ئومێدەوارم الله منەت بکات بەسەر ئەو کەسەی کە ئەیبیستێت یان پێی ئەگات.

وتی: ئەمەم لێ وەرگرە، لە قسەدا فیتنەیە، وە کردەوە ئەولاترە بە ئیماندار لە قسە).

**٥٣** - **قال ابن أبي الدنيا**: **حدثنا محمد بن يزيد حدثنا مصعب بن المقدام، حدثنا داود بن نصير، عن الأعمش، عن ابن عون عن إبراهيم قال**: (كانوا يكرهون إذا اجتمعوا أن يظهر الرجل أحسن ما عنده).

**٥٣** - إبراهيم النخعي ئەڵێ: (ئەوان - **واتە هاوەڵان** - ڕقیان لەوە بوو کاتێک کۆببونایەتەوە پیاو باشترینی خۆی دەربخات).

٥٤ - **قال ابن أبي الدنيا :** حدثني أحمد بن إبراهيم حدثني أحمد بن عبد الله بن يونس حدثنا فضيل، عن السري بن يحيى : (أن عمر بن عبد العزيز خطب، فحمد الله، ثم خنقته العبرة، ثم قال : يا أيها الناس، أصلحوا آخرتكم يصلح الله لكم دنياكم وأصلحوا سرائركم يصلح الله لكم علانيتكم، والله إن عبداً ليس بينه وبين آدم أب له إلا قد مات لمعرق له في الموت، كما يقال لمعرق في الكرم، أي له عرق في ذلك لا محالة).

٥٤ - السري بن يحيى ئەڵێ : (عمر بن عبدالعزيز وتاری دا، سوپاسی الله ی کرد، پاشان گریان قورگی کرد، دواتر وتی : ئەی خەڵکینە قیامەتی خۆتان باش بکەن الله دنیاکەتان بۆ باش ئەکات، وە نهێنی و پەنهانتان باش بکەن الله رووکەش و دەرەوەتان بۆ باش ئەکات، وە سوێند بە الله بەندە لە نێوان خۆی و ئادەم دا هیچ باوانێکی نییە ئیللا مردووە . . . ).

٥٥ - **قال ابن أبي الدنيا :** حدثني إسحاق بن إسماعيل، قال: حدثني جرير، عن ليث، عن أبي العالية قال : اجتمع إلي أصحاب محمد ﷺ فقالوا : يا أبا العالية، لا تعمل عملاً تريد به غير الله فتجعل الله ثوابك على من أردت، ويا أبا العالية، لا تتكل على غير الله فيكلك الله إلى من توكلت عليه).

٥٥ - أبي العالية ئەڵێ : هاوەڵانی محمد ﷺ کۆبوونەوە لام، فەرموویان : (ئەی أبا العالية کردەوەیەک ئەنجام مەدە کە مەبەستت پێی غەیری الله بێت، الله پاداشتەکەت لەسەر ئەوە دائەنێت کە بۆت کردووە، وە ئەی أبا العالية تەوەکول مەکە لەسەر غەیری الله، الله ئەتداتە دەستی ئەوەی تەوەکولت لەسەر کردووە).

٥٦ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا عبد الرحمن بن واقد قال حدثنا ضمرة، عن رجاء بن أبي سلمة، عن عبد الله بن أبي نعيم، عن ابن محيريز : (أن عمر بن الخطاب الله دعي إلى وليمة، فلما أكل وخرج قال : وددت أني لم أحضر هذا الطعام.

قيل له : لم يا أمير المؤمنين ؟.

قال : إني أظن صاحبكم لم يعمله إلا رياء).

٥٦ - ابن محيريز ئەڵێ : عمر بن الخطاب رضي الله عنه بانگ كرا بۆ وەلیمەیەک، کاتێک نانی خوارد و ڕۆشتە دەرەوە فەرمووی : خۆزگە ئەخوازم ئامادەی ئەم خوانە نەبوومایە .

پێی وترا بۆچی ئەی پێشەوای باوەڕداران ؟

فەرمووی : وا گومان ئەبەم هاوەڵەکەتان ئەمەی نەکردبێت ئیللا بۆ ڕیایی نەبێت ) .

والحمد لله رب العالمین، الله تعالی وامان لێ بکات هەموو کار و کردەوە و وتەیەکمان تەنها لەپێناو خۆی بێت، آمین

https://t.me/ibnuabydunya